**چەرچل : ئێمە نموونەی دیموکراسین .. خەڵك لە زوڵمی ـ**
ـ هیتلەر ڕزگار دەکەین .. ومافی میللەتان دەپارێزین .. حەق و ڕاستی مان لەگەڵدایە .. جەنگ و داوامان ڕەوایە ..
**هاورێ یەکان** : بەڵێ .. بەڵێ قوربان وایە ..!
**ئەیزنهاوەر** : ئەگەر هەموو میللەتانی ئەم دونیایە پشتگیریمان ـ
ـ نەکەن و ڕێگا لە هیتلەر نەگرین .. ئەم پیاوە شێتە شارستانی یەتی لە ناو دەبـاو هیچ نـاهێڵێ و مـافی میللەتان دەخـوات .. بەڵام ئـەگەر ئێمـە بە سەرکەوتین ئەوە بێ گومان مافی ئەو میللەتانە دەدەینەوە .. ئێمەینە کە حەق و ڕاستی مان لەگەڵدایە ..

**هاورێ یەکان : بەڵێ ... بەڵێ قوربان وایە ..!**
**« هەموویان لە شانۆ دەردەچن و مێژو مێژونوس دێنە دەرەوە لە پەنایەکانیانەوە » .**
**مێژو : دیتت چۆن ڕووداوەکە لە پێش چاوت ڕویشت .. کێ لەوانە لە سەر حەق بوو .. هەر یەکەکیان خۆی بـە خاوەنی داوای ڕەواو و حەق و ڕاستی دەزانێت .. پێم ناڵی کێ لەسەر حەقە ..؟**
**مێژونووس : کێشەکە زۆر ئالوزە .. کە چی ئەنجامی جەنگ و**
دووڕانی هیتلەر دەریخست و ئاشکرای کرد کە هیتلەر لە سـەر حەق نەبوو .. زالم بوو .. مافی میللەتانی دەخوارد .. ئیشی خەراپی دەکرد لە بەر ئەوە هاتە بەزین و سەرنەکەوت .
**مێژو : پیرەمێرد لێرەدا پرسیارێکت لێ دەپرسم .. ئەگەر ـ**
ـ هیتلەر سەرکەوتبا .. ئەو کاتە حەق لە گەڵ کێ دەبوو
**مێژونووس : نازانم .. هەر ئەو هێندە دەزانم کە حەق لە گەل هێزو تواناو قووەتە ..!**
**مێژو : ئاشکرابوو کە هەر دوو لا مەبەستیان چەوسانەوەی ـ**
ـ خەلك و میللەتان بوو ... بۆ بەرژەوەندی خۆیان هەر یەکەکیان دیگوت من بەرگری لە مافی میللەتان دەکەم و حەقیان دەدەمێ ئەگەر جەنگ نەماو بە سەرکەوتین .. کە چی هیچ وا نەبوو بەڵێ بو سوودو قازانجی خـۆیان هەموو کـارێکیان دەکـرد .. ئەبێ ئـەو شتەتـان گوتبـا .. هیتلەرو دارو دەستەی و هەموو لایەکانی حولەفا بو یەك مەبەست بوو .. هەوڵیان دەدا

هەر لایەك بە لای خۆیەوە زیاتر خاك بگریت و میللەت و زەوی بكەریتە ژێر دەستی .. هیچ لایەكیان لە لایتر چاكتر نەبوون .. هەر بۆ چەوساندنەوەو هیچی تر ..!

**مێژونووس : وایە .. بەڵام .. بەڵام زۆر زەحمەتە ..!!**

**مێژو : دە بابروین .. زیاتر مەهزەلەی ئەنكو مێژونووسان ببینین ...**

**«رووناكی كز دەبێ و هەر یەكەكیان بە لایەكەوە دەروات و شانۆ خالی و تاریك دەبێت»**



## «تابلوی چوارەم»

**«دەنگە دەنگی بڵندو موسیقای توند لە دەرەوەی شانو و کزی و روشەنی روناکی لە ناو شانۆ بە هەموو رەنگ .. ئەفسەرێك لەگەڵ چەند جەندرمەو کەسێکی تر دێنە ناو شانۆدا .**

**ئەفسەر** : **ئێمە دەولەتین .. لە رۆژ هەلات .. لە رۆژ ئاوا ..**

لە ژورو لە خوارو .. ئارامی و ئاسایش بۆ میللەتان پەیدا دەکەین .. دوژمنانیان لێ دووردەکەینەوە .. ئەوانەی بە گومان و ناکۆکی دەجوڵێنەوەو پڕبێژو ئاخوتن زۆرن .. ناوی هەموو جوری بێ واتاو مانا دینن وەکو یەکسانی و دیموکراسی و شتی لا بەلاو ئاژاوە درۆست دەکەن و بە بێ مێشکی خۆیان بە خاوەنی حەق دەزانن .. کە چی لە حەق دوورن .. چاك بزانن ئێمە ی دەولەت و زاناو خاوەن شارستانی یەت و فەرماندەو دەولەمەند هەمیشە لە سەر حەقین و راستیمان لەگەلدایە ..

**هاورێ یەکانی** : بەڵێ .. بەڵێ ... قوربان وایە ..!

**«لە سەر ئاوازی موسیقای سەربازی دەردەچن پاشان چەند رەش و رۆت و جل دڕاو دێنەناو شانودا و تەماشای یەك و دوو دەکەن و بە ترس و لەرزو شەبرزەیی یەوە هەموو لایەکی شانۆدا دەسورێنەوە یەکەکیان «شورشگێرە» دەلێت»**

**شورشگێر** : **هەڤاڵانی هاودەردی من .. ئێمەی رەش و رۆت .**

ئێمەی چەوساوە .. ئێمەی هەژار .. ئێمەی ماف خوراو .. هیـچ مان ناوێ جگە لە وەی کە وەك مرۆڤ بژین و خاوەن حەق و راستی بین .. لە رۆژانی سپارتاکۆسەوە تا ئێمرو هەروا غار دەدەین و دستمان بەتاڵەو بە هیچ ناگەین لە بەر چی ...؟ ئەبێ بزانین .. دەرمانمان یەکگرتنە .. مافمان رەوایە .. مافی ژیان و ئاخوتن و خوێندن و زمان و نیشتیمانان هەبێ .. ئەم مافانە داوای رەوای خۆمانە .. کەچی ئەوانـەی دەیانـەوێ بمانخـون و ئاگرمان بکوژێننەوە هەر وەك لە کۆنەوە وا بوون .. ناحەقن و کارەکەیان نارەوایە .. براینە چاك بزانن حەق و راستی رێگای ئێمەیە ! هەموویـان پێکەوە : ئێمە لە سەر حەقین .. ئەو کەسانەی ئەیانەوێ ئاگری هـەست ویەکگرتن و شورشمان بکوژێننە و ناحەقن .. کاریان نارەوایەو دوورن لە راستی ..!

**«بە ترس و لەرزو شەپرزەیی یەوە لە ناو شانۆدا دەسـورێنەوە و دەردەچن .. هەر یەك بە لایەکەوەو مێژو لەگەل مێژونووس دێنەوە ناو شانودا ..**

**مێژو : دەوەرە پیرەمێردی خاوەن خامەی رەنگین .. کیها**
کۆمەڵ لەو کۆمەلانەی لە بەر چاوەکانتدا رویشتن و تێپەرین راستن و لە سەر حەقن و داوایان رەوایە ..؟

**مێژونووس : نووسینی مێژو .. لە هەموو کاتێکدا و هەمیشە لەگەڵ هێزو توانادا بویە .. واتە مێژونووس هەموو دەمێك لەگەڵ دەولەتدا بووینە .. یان خۆیان واتە مێژو نووسان فەرماندە یان کاربەدەست بووینە لە ناو ئەو دەوڵەت و زەمانەی مێژو تێدا نووسیوەتەوە .. لە بەر ئەوەی یان خۆیان فەرماندەن یان کاربەدەستی دەوڵەت بووینەو نانی دەولەتیان خـواردووە .. لە بەر ئـەوە هەر دەوڵەت و هێـزو کاربەدەستان لە سەر حەقن .. ئەگەر مێژونووسێك بـاسی غەیـری ئەوان بکات بو نمونە باسی هەژارو رەش وروت ئەوانەی تر بکات و شتێك دەربارەیان بنوسێت ... بێ گومان هیچ کەس گوێی لێ ناگرێت و نوسراوەکەی دەسوتێنن و تەنانەت قەلەم و کاغەزیشی لێ قـەدەغە دەکەن و ئەگەر نووسینەکانیان مانەوەو بە بەر رەشەبای بە هێزو توانا نەکەوتن .. ئەوەندە لە کۆن وقوژبنی تاریك دەمێننەوە تا بەزر دەبن یان لە ناو دەچن .**

مێژو : ئەو تو ئەی پیرەمێرد کێ بە خاوەن حەق دەزانی ..؟
مێژونووس : پرسیار لە من مەکە .. لە وانە بپرسە ..!!
«پەنجە بو دانیشتوانی ناو هول رادەکێشی و روناکی کز دەبێت وشانو تارێك دەبێت و هەر کەسێك بە لایەکەوە دەردەچێت»



## «تابلۆی پێنجەم»

«روناکی بە هەموو رەنگ بە توندی روشەن دەبێت دەکوژێتەوە .. دوو پیاو یکی گەنج و یەکی پیر دێنە ناو شانودا و مێژو مێژونووس هەر یەکەك لە پەنایەك خۆی شاردوتەوە» .

پیاوی پیر : نابێ .. بابە نابێ ...!!
پیاوی گەنج : چۆن نـابێ .. ژن ژی وەك ئێمە مـرۆڤن و ئەوانیش حەقی ژیانیان هەیە .. ژن توانی هەر کارێکی پیاو ئەنجام بدا ئەویش بە رێك و پێکی ئەنجام بدا ..!
پیر : ژن بو ناو ماڵ و .. بو بە خێوکردنی منال هاتونەتە دونیاو هیچی تر ..!
گەنج : ئاخر وا نی یە ..!

پیر : چۆن وا نی یە ..؟ ئەتەوێ ژن و پیاو تێکەڵی یەکبن و خەراپەو بێ رەوشتی زۆر ببێت و ئەخلاق نە مێنن .؟!
گەنج : زەمانی کۆن رۆیشت کە بازرگانی بە ژن دەکرا .. ژنیشن وەك ئێمە مافیان هەیەو ئەبێ ماڤی خۆیان وەرگرن ..!
پیر : کۆرە حەقی چی و ترەماشی چی .. ئەنگو دەتانەوێ قانـون و یاسای دونیاو مێژو بگورن .. شتی وا هەرگیز نەبووەو نابێ ..!
«بە تورەیی دەردەچێ لە شانو»

گەنج «لە گەڵ دانیشتوانی ناو هۆڵدا» دیت تان چۆن مێشکی وەك بەرد ڕەقە .. ماف و حەقی خەڵك ناناسێت و کەس بە هیچ نازانێت .
«گەنجە کە دەردەچێت لە شانو و پاشان ژنێك دێتە ژۆرێ»
ژنەکە : ئەی هاوار .. دە وەرن ئەو کەرە لەو قوڕە

دەربێنن .. من خوێندوومە .. شەهادەم هەیە .. گەیشتـومەتـە سەر مانگ و بە ئاسماندا هەلسوراوم بە موشەك و ساروخ بوومە سەرەك وەزیرو وەزیر بوومەتە زانای فەلەك و فەزاو پزیشکی و فیزیا و کیمیای و ئەندازیاری و ئاسمان .. هەر دەڵێن : تو بو ماڵ و منال خوڵقاوی .. مافم نادەنێ .. یان بە رای هیندەکان هەر مافم نی یە .. حەقم نی یە .. ئەبێ بەم ڕێگایەدا بروم و داوای مافی خۆم بکەم و راستی ئاشکراکەم و بە هێزو تواناوە لە دەست کۆنە پەرستان دەربێنم .

«دەچتە دەرەوە و مێژو مێژونووس دێنەوە ناو شانۆ»
مێژو : دیتت چەند ماف خوراو هەن .. ئەو ژنانە کە نیوەی کۆمەڵن .. بۆ حەق و مافیان نادرێتێ ..؟!
مێژونووس : بەلکو نهو یان لە ئایندەدا شتێکیان پێ بدرێت دەنا بە درێژی مێژو هیچ حەقیان نەبووە ..!
مێژو : خەتا لە ئەنگویە .. ئەنگو ئەو شتانە نانووسن .. هەر ئەوانە دەنووسن کە پەیوەندی بە هێزەوە هەیە .. بە کار بەدەستان و گەورە پیاوان هەیەو بو بەرژەوەندی ئەوان دەنووسن و هیچی تر ..
مێژونووس : نە باب و نە .. وا نی یە ..!
«بە جوڵانەوەیەکی کۆمیدی ئەم ئاخوتنا نە ئەکاو ڕوناکی کز دەبێ و هەر یەکەکیان دەچتەو پەنایەکەی خۆی»



# « تابلۆی شەشەم »

( دەنگە دەنگ و هەرایەکی مەزن لەگەل دەنگی مۆسیقای نـارێك لە دەرەوە ی شانۆ دێتو روناکی کزو ڕۆشەن دبێتو سێ جوار کەس دێنـە نـاو شـانـو و مـروڤێکیـان لە دوای خـۆیـانـدا رادەکێشن و لێ یدەدەن .. )

**پیاوێك** :ـ لیرە راوەستە ..

(« ئیشارەن بو مروڤە جل دراو بە دوایدا راکێشـاو دەکات پـاشان چەند پیاو ی ما قول بە جلو بە رگی جوان و تازە لە گەل ئەفسەرێك دێنە ژوری لە گەل چەند پولیسەك هێندەکیان لە سەرچەند کورسی دادە نیشن لە دەوروبـەری ئـەفسـەرەکـەو هێنـدەکیـان هـەروا رادەوەستن » )

**پیاوماقولەك** : کورە هەی هیچ وپوچ بو وا دەکەی .. لە ئێمە یـاخی دەبی .. دەلێی زەوی هی خومە .. خەلك هاندەدەی بو خەراپە .. کـەی مێشکت دە بیو ئەقل دێتە ناو ئەم سەر ە زلەت ..؟!

**پیاوەکە** : قوربان هیچم نەکردوە جگە لە وەی داوا کاری حەقی خومە .

**پیاو ی ماقول** : حەقی چی ... کەی حەقت هەبووە بێمێشك ؟

**پیاوەکە** : قوربان ئەو زەوییەی تۆ باس دەکەی ، زەوی باب و باپیرمە .. هەموومان کارمان تێدا کردوە .. ئێمە دە کێلین .. دەچینین وئارەق دریژین نا دەوروینـەوە .. ئەو دەرەبـەگانـە (« **ئیشارەت بـە ئەوانـەی لە سەر کورسییەکان دانیشتون دەکـات** » ) دێن ولێمان دەستێنن ودەلێن هی ئێمەیە .. کێ دە لێت ئەوان لە سەر حەقن قوربان ..؟!

**پیاو ی ما قول** : زەوی بە زێری لیرەی زەری کراوە .. چون تۆ دەلێیت هی منە ..؟

**پیاوەکە** : تەماشای هەموو ئایینەکانی سەر زەوی بکا .. هەموو فەلسەفاکانی جیهان ببینە .. گوهـ بدە زەمیری سرۆشایەتی دا بزانی حەق لە گەل کیها ماندایە ..؟

**ئەفسەر** : ئێمە ئەوە نازانین .. هەر ئەو هێندە دەزانین .. قاقانی و تاپوی وزەوی‌یەکەی لە لای کی‌یە .. ئەوە خاوەنی . لێرەش دا ئەون خاوەن .. حەقن بە پێی یاساو قانونی میری دەجولێنە وەو بە پێ ی ئەم یاسایە ئەوان لە سەر حەقن

**پیاوەکە** : ئەو یاساو قانونانەی خۆتان نووسیتانە و داتانناون .. بو ئەنگو نی‌یە ئەم یاساو قانونانە .. هەر لە سەر خەلکی هەژارو بێ دەسهەلات و رەش و لاوت دەسەپێنن ..!

**ئەفسەر** : کرِ بە ... ئەوەشێشی تۆ نی‌یە !!

ئەگەر یەکەك‌لەوان

**پیاوی ما قول** : باشە ... باش .. ئەو لە لایەك ، بەلام بو خەلك هاندەدەی بو بەر پاکردنی هەراو هوریاو

ـ خەراپەو رێ گری و تەسەل نەبوون ..؟!

**پیاوەکە** : من خەلك هاندەدەم بو ئەوەی لە ماف خۆیان بیرسن .. شۆرش بەرپاکەن .. ئاگری حەق و ماف داگرسینن و راستی بچەسپینن ..ئەم کارانە ژی هەراو هوریاو رێ گری وخەراپە نینە .. ئەگەر ئەنگو وای بدەنە قەلەم ئەوە شتێکی ترە ..!

**ئەفسەر** : بزانە زمانی چەند درێژە .. کۆرەکەی تۆ لە سەر حەقی .. خانە خەراپ داوای کیها ماف دەکەی .. تۆ زەوی خەلکت زەوت کردوەو دەلێی لە سەر حەقم ...

رێگام راستی‌یە .. ئەدی خەراپە وخواری چۆنن ..؟!

**پیاوەکە : بزانن ئەو کەسەیە خاوەنی حەق و ماف .. ئەوی ئارەق دە رێژێ و ماندوو دەبێ و داوای ما فی رەوای خۆی دەکا .. بەلام ئەو کەسەی ماف مروڤ دەخواو خەلك دەچەوسێنتە وە ئەو پیاوی خەراپە ..!**

**( ئەفسەرەکە دێت وێنێزیکی دەبێت و چەند شاپی لێدەداو دەری‌دەکاتە دەرەوەدو پاشان تێکدێن وێتکدەچن و هەموویان**

**هـەریەك بـەلایەكـەوە دەردەچێت و مێژو مێـژونووس لە پـەنایـە كانیانەود دەردەچن »)** .

**مێژو** : ئەو هەموو نموّنانـە . بەڵێ ئـەو نموّنـە جور بـە جورانـەت دیتن پیرەمێرد .. كێ لەوانە لە سەر حەق بوو و ما ڤی رەوابوو ..؟!

**مێژو نووس** : من ناتوانم ئاخوتنەكانم دو بارەو سێ بارە كاوێژكەمەوە .. پێم گوتی رام چی یەو.. ئیتر تەواو ..!

**مێژو** : وا دەپرسم جـارێكی تر .. كێ لەسـەر حەقـە ..؟ لە پێش چاوی شاهیدەكانمان .

**« ئیشارەن بۆ دانیشتوان دەكات »**

**مێژو نووس** :بوّ بەس لە من دەپرسی ...؟!

**مێژو** : ئەدی لە كێ بپرسم ..؟ ئەنگو نە شت دەنووسنەوە .. بو ئەوانەی لە دواتاندا دێن بە جێ دێلن .. ئەوانیش پەیرەوی شتەكانتان دەكەن و گوێ لێ رادەگرن .. یان لەعنەتان بو دەنێرن یـان ژی دەڵێن .. ئافـە رین ..مێژو نووسانی ئایندە ژی چاو لە ئەنگو دەكەن .. لەبەر ئەوەی ئەو شتانـەی دەنـووسنەدە دەبنـە سەرو چـاوە بـو ئـەوان .. فێجـا ئـەگـەر لە تـوو هاورێ یەكانی كوّن و نهوی تو نەپرسم ... ئەدی لە كێ بپرسم ..؟

**مێژو نووس** : لە من بە تەنها مەپرسە .. لە وانەی پێش ئێمە هاتونە ئەم دوینایەو لە وانەی نهوو لە وانە ژی ( **«ئیشارە،~ ·؟ · انشتوان دەكا»** ) ئا .. ئا لە مانە ژی بپرسە .. هەر واش لە وا.. بە دواماندا دێن دووبارە بپرسە ..! .

**مێژو** : ئەنجامی پرسیارەكەم هیچ ولاّمی نەبوو .. هەروا وابزانم ولامی نابیسمەوە ..؟!

**مێژو نووس : ئەوەی نازانم .. چونكە توّ بە هیچ قانیع نابی .. هەر چی پێت بلێم ..؟!**

**مێژو** : هەر وەك لە سەرەتادا گوتم ئەو پرسیارە لە ئەزەلدا تا ئەبەد هەر بێ ولاّم ماوە ودەمینێ كەچی .. هەمیشە دە لێم و دەلێمەوە لە كێ بپیرسم ..؟!

**( « پەردەی شانو دادێخرێت وچیروّك بێژ دێتە وەپێش » )**

**چیروك بێژ** : هەڤالانی ئازیز .. لە م چیروّكە شانویی یەدا بە چاكی لاتان روون و ئاشكرابو كە هێشتا ولاّمی پرسیاری مێژو نەدوزراوەتە وە نادوزرێتە

وه .. ئایا کێ له سه‌ر حه‌قه ..؟ حه‌ق چی‌یه ..؟ ئه‌و شتانه ی پێچه‌وانه‌ی ئه‌وانن چین ..؟ ئه‌بێ ئه‌م پرسیارانه

له کێ بکه‌ین ..؟

کیها کۆمه‌ڵ ..؟

کیها مرۆڤ ..؟

کیها خاوه‌ن ده‌سه‌لات‌و ده‌وله‌ت ..؟

کیها هه‌ژارو بێ ده‌سه‌لات ..؟

کیها بیرتیژو روشه‌نبیرو نووسه‌ر ..؟

وڵامی گه‌لێك زه‌حمه‌ته ..!

له فه‌یله‌سوفان بپرسین ..؟ به‌لام کیها فه‌یله‌سوف ..؟

رۆژهه‌لاتی یا رۆژ ئاوایی ..؟ ژۆرو یا خوارو ..؟

فه‌یله‌سوفی کیها پارچه‌ی ئه‌م جیهانه ..؟

کیها بیرو فیکر ..؟

وا دیاره وڵامی ئه‌م پرسیارانه گه‌لێك له پرسیاری یه‌گه‌م گرانترو زه‌حمه‌تتر دیارن .. هه‌ر وه‌ها فه‌یله‌سوفان ژی به هه‌موو گه‌ران‌و سوران‌و قسه‌و بێژه‌و ئاخۆتنیان ناتوانن وڵامی ئه‌م پرسیارانه بده‌نه‌وه . هه‌ر که‌سێك بو خۆی .. به که‌یفی خۆی .. به دلی خۆی وڵام ده‌رازێنێته‌وه .. له به‌ر ئه‌وه زۆر زه‌حمه‌ته .. هه‌ر وه‌ك گوتم زۆر زه‌حمه‌ته دوزینه‌وه ی وڵام بو ئه‌م پرسیاره له کۆن‌و نه‌ود ئاینده‌شدا هه‌روا ده‌مێنته وه .. ئه‌و پرسیاره ئاراسته‌ی ئێوی به‌رێز ده‌که‌م .. به‌لام وابزانم ئه‌بێ ئه‌م پرسیاره له زه‌میری خۆمان بپرسین چاکتره .. زه‌میری پاك زه‌میرو ده‌رونی بێ‌گه‌ردی مرۆڤایه‌تی .. هه‌ر که‌سێك له ئێمه ژی هه‌ر وه‌کو ئه‌وانه‌ی‌تر به‌که‌یفی خۆمان وڵامه‌ك ده‌بینینه‌وه ... به لام تا چێ رانده‌یه‌ك ئه‌توانین پر به پێستی پرسیاره‌که وڵام بده‌ینه‌وه ..؟

ئه‌وه‌ش پرسیارێکی تره .. له به‌ر ئه‌وه وا ئێمه له گێژاوێکی پرسیاردا ماوین .. ئه‌بێ تا ماوین هه‌ر بپرسین و .. بگه‌رێین تا بزانین ئه‌م پرسیاره له کێ بکه‌ین و.. من و تۆو هه‌مو که‌سێك هه‌ر بلێین .. له کێ بپرسم ..؟!

**ته‌واو**



# قرقاش

کات : هەردەمێك
جێگا : هەر جێگایەك

نووسینی ـ بە عارەبی

« سمیح القاسم »

**ئەکتەران :-**

قرقاش : چەند جوتیار ، چەند دەوڵەمەندو ماقول ، چەند سەرباز ، جوتیارێکی شورشگێر ، دزەك ، منالێك ژنێك ، کچێك ، گەنجێك « کوری قرقاش » ، دەرگەوان ، وەزیرەکی ریشدار ، سەربازێکی قوڵ براو ، پیاوێك ، ژنێك ، کۆمەلێك لەیونانیەکانی کۆن وکۆمەلێك لە میسرییەکانی کۆن ، کۆمەلێك لە ئەوروپاییەکانی هاوچەرخ ، کورس .

تێبینی : تەماشە کەران ئەتوانن هاوبەشی لە گفت وگۆو ئاخوتن لەگەڵ ئەکتەراندا بکەن ورای خۆیان دەربرن چۆن حەزدەکەن .

**« سەرەتا »**

**( « پەردەلادەدرێ .. شانۆ روناك دەبێ بە کزی »)**

**کورس** : هەموو کاتێك ... لە هەموو جێگایەك

لەسەر وێنەی مرۆڤێك دێت

دێت ومردنی لە گەڵیا دێت

دەنگێکە هەر بەرز ئەبێت

کە هاتیش هیچ راناوە ستێت

لەهەموو کاتێکدا ژیاوە

لە هەموو جێگایەکدا ژیاوە

قرقاشی ناوە .. قرقاشی ناوە .

قرقاشی ناوە

(« روناکی شانۆبە پەلە توندو کزدەبێت لە گەڵ ئاوازی موسیقایەکی نارێك وگراندا . کۆمەڵەمرۆڤێك بەجل وبەرگی یونانییەکانی کۆن دێنە ژوری شانۆ ... کۆت وزنجیریان لە دەست وپێ دایە .. بەناو شانۆدا تێدەپەرن لەگەڵ ئاوازی موسیقادا .. پیاوێکی تربە هەمان جل وبەرگ بە قامچیو سوندەودار لێ یان دەدات ، تادەردەچن لە شانۆ .. پاشان کۆمەڵێك بەجل وبەرگی میسرییە کۆنەکانبە هەمان وێنەی پێشوودا لە شانۆدا تێدەپەرن .. لە پاشاندا کۆمەڵێكلە ئەوروپاییەکانی هاوچەرخ دێنە ناوشانۆ .. وێنەیەکی مەزنی هیتلریان هەڵگرتوەبەدەنگێکی بڵند هاواردەکەن « هایل هیتلەر .. هایل هیتلەر » .. شانۆ چوڵ دەبێ وروناکی-

- یەکەی کز دەبێتەوە )

## ـ دیمەنی یەکەم ـ

**(« دەرەبەگ دەچتە سەر عەرش بە پەیسکی برسایەتی »)**

( کومەڵێك جوتیاردێنە ناوشانۆلە هەموو لایەکەوە . هیندەکیان دادەنیش .. چەندیان لە حاڵەتی سەرنواندن وکڕنوش بردنن .. هێندەکیان وەستاون هەریەکەك رووی بۆ لایەکە .

کۆمەڵەمرۆفێك دێنە ژوری شانۆبە جل وبەرگی پاكو رێك .. هەموویان تەماشای یەکتردەکەن بە بێ ئاخفتن .. تیشکی روناکی بۆیەکەك لە کۆمەڵی دوەم دەچێ وبە چاکی ئاشکرای دەکا ) .

کۆرس : چی بکەین ....؟

**جویتارەك** : عەمبارەکانی گەنم ڤالابوون ..!

**جوتایرەك** : دەرختەکانمان هەمووهیشك بوون ..!

**جوتیارەك** : ڕانە مەڕو ئاژەلەکان دەمرن ..!

**جوتیارەك** : شوڤ وپەرێزە کان دەسووتێن ..

**کورس** : چی بکەین ..؟ چی بکەین ..؟!

**(« پیاوە ماقوڵە کان سەرنەوی‌وبێ ئاخوتن دەمینێن .. تیشکی روناکی پیاوێکی ماقول نیشان دەدەدا .» )**

**جوتیارە ك** : ئاسۆبە پەلەهەوری‌رەش .. تاریك‌داهات بیرەکانی گوندی ئێمەپاك هیشك بوون .

**جوتیارەك** : **هاواری ترس وتوقین .**

**لەدەمی منداڵە کانمانەوە دەر دەچێ .**

**جوتیارەك** : رووی زەوی دەکێلرێت .. هاوا قلیشاوە بە ماندووبوونی قۆڵ وشانی ئارەقرێژ

**کۆرس** : ولأم بدەوە قوربان .

دریغی مەفەرمو .. گەورەمان

(« تیشکی روناکی پیاوی ما قولی یەکەمبەجێ دێلێ بۆ دووەمیان ئەوژی هیچ جولانەوەو . ئاخوتن ناکات پاشان دەگە ڕێتەوە بۆ سێیەمیان .. هەراو هوریایەك لەدەرەوەی شانۆ دەبیستری .. روناکی هەموو شانۆ ڕوشەن دەکاوهەموو ئەوانەی لە ناوشانۆدان تەماشای ئەولایە دەکەن کە دەنگەکە لێ‌ی‌دێت .. دەنگی هەوارو تەپەی پێ‌ی پیاوێك نێزیك دەبێ .. جوتیارەك دێتە ناوشانۆ شەپرزەوجل دڕاوە . چەند پەلەی خوێنی بەجلیەوەدیارن .. ئیشارەت بۆئەو جێگایە دەکا کەلێ‌ی هاتۆتەژۆرێ .. ئەیەوێ قسەبکاو ناتوانێت » )

**پیاوێکی ما قول** : چیت بە دواوەیە ..؟

ئەم هەرایە چی‌بو وبۆ چی‌یە ..؟

**پیاوێکی ماقولی‌تر** : (« بە تیزو گەمەوە » )

ئەوەیە کاری بێ مێشکان

وادەبێ ئیشی نەزانان

**پیاوێکی ما قولی تر** : (« جوتیارەکە دەگریت و بەتوندی قولی دەهەژێنێ‌و

وهەوار دەکالە سەری ») .

کام خوای خراپە .. زمانی گرێ داوی ..؟

چیت بەدواوەیە ..؟ دەبلێ .. بێ‌مێشك چی‌بووە ..؟

**جوتیار** : دوکانی باز رگانان تالان کران

هەر کەسی بەرگری کردن کوژران

هێرشی پیاوی گەورە .

ئەسپی ئاگر یان کوژاندەوە

(« چەند پیاوی ماقول وچەند جوتیار بۆ ئەو لایەی جوتیارەکە ئیشارەتی بۆی کردبو رادەکەن‌و هاواردەکەن » )

**پیاوێکی ماقول** : بڕوخێ .. بڕوخێ .

هەلکەری ئاگری ئاژاوەو کارەسات

بڕوخێ .. بڕوخێ ..

ئەو کەسی دووبەرەکی دەخاتە ناو کۆمەڵەوە

مردن ورووخان بۆئەوانە

مردن وروخان بۆ ئەوانە

جوتیارەکان : چی‌یە ..؟ چ بووە ..؟ چی بکەین ..؟
چی‌بکەین ..؟ چ بووە .. چی‌یە ..؟

**(« لەدەرەوەی شانۆدەنگی تەپەتەپ بە توندی دێت .. رەشە بایەکی تیژ وتوندوپڕ تۆزوودرکەڵ دێتە ناوشانو .. قرقاش بەشەقاوی خێرا دێتە ژۆر . خەڵکی سەرشانو « میللەت » بە چەشنێکی شەپرزە کڕوبێ دەنگدە بن .. قرقاش لەناوەندیاندا رادەوەستێت . دەستێکی دەخانە بەرپشتی و دەستێکی لەسەرشەمشیرەکەی دادەنێت و پێدا دێنێت ودەبات وبەچاوێکی خۆپەرستانەو بلندوروح مەزنی تەماشای ئەوانەی لە دەوروبەری راوەستاون دەکات ودەلێت »)** :

**قرقاش** : چیتانە وا کڕو بێزار

ئەی میللەتی منی هەژار
جووت دەکەن وخاك دەکێڵن
سەرتان سورەو چاوتان لێڵن
لەناو گەرداوێکی مەنگن
چیتانە بۆوا بێ دەنگن .
ئەی پیاوانی کازێوەو ئاسوی بێ سود

**(« لە نێوانیاندا دێت بە هنگاوی توندو قورس .. لچیان لێ خواردەکات وەو گالتەیان پێ‌دەکات وپێ‌یان پێدەکەنێت »)**

**قرقاش** : ئەنگوبۆتن .. بۆتی بەردن ..؟

ئادەمین .. یاخۆ دەستکردن ؟
ترس لە چاوتان دەبارێ
ملی کەچتان هاتوتە خوارێ
ئەنگوبۆتن ..بۆتی بەردن ..؟
ئادەمین یاخۆ دەستکردن ..؟

**(« لە ناو خەلکەکەدا چاو دەگێرێ بە گالتەو لوت بڵندی‌یەوە دەڵێت»)** .

**قرقاش** : کوا وەلامتان ..؟

جگەلەمن .. هیچ کەس نی‌یە بێتە زمان
من هەر خۆم تاك وتەنها

گیرو گرفتان دەکەم رەها
لێم گەڕێن هەی بێ مێشکینە
هەموو کارێك راست کەمەوە
ئاشتی وخوشی لە دەست چوتان
ئەبێ بۆتان بگەڕێنمەوە
لێم گەڕێن .. تاهەموو خەمان
لە نێو دڵان بسترمەوە
ناو چاوانی کەون وزەمان
بۆ دارەکەم کرنوش دەبا
باڵم بەسەر هەر زەویەکا
درێژ کەم وپێ دابێنم
چێ نەگبەتی و نەهاتی‌یە
دەبێتە پیت و بەرەکەت
**جوتیارێکی شورەشگێر :**
نەچوەعەقڵم ... نەچوە مێشکم
ئەوە قەوزە .. لەدەم ئاوان
پوش وپەلاشی دەم روبار
وەك وشەی تو بێ قیمەتە
**(« جوتیار بە سینگی دەرپەڕی‌یەوە و بێ‌ترس و دەنگ بلندی دەبێت » )**
قرقاش .. قرقاش .. هەر چەندێکی تۆ یەکەم‌بی
لەدڕوندەی خوێن مێژی کێو بەهێزتربی
باڵت بۆ سەردەرزە کانی هیشکی زەمین
درێژ بکەی سایەی باڵت
بکەیتە هەورێکی ئاوز
پڕکەی وەکو گۆانی چێلان ..
**(« بەتیزو گاڵتەوە » )**
ئەگەر وەکو ئەستورایی دەهۆڵێکی . لێدراوبێ
دێوبی .. درنجی کێو بی .. دەست وەشێن بی
خوای جادوی

بەسەر پەرێزی درِك ودالْ هەنگاوبنێ ی
هەمووی ببێتە چیمەن وگولْ وگولْزار
ئەرێ قرقاش ..!!
چێ قازانجێك لە میوەی ناو خەوتان هەیە
گەرنەزانین تۆوی چییەو لەچی بووە
پەلك و وتویکلی وشەکانی خوت بشکێنە
کاکڵەی تووی بیرەکانتمان بۆدەرێنە
**قرقاش : ئائەمەیە کاری پیاوی بێ دەست هەلاّت**
**رێگای مروڤی ترسنۆك**
**دانیشتنی بە قرِوقەپ .**
**لە سەر بستێك زەوی رِەقدا**
**بە هەزاران نوکی شەمشێر .**
**درەختی بەر مێوە نادا**
**(« چاوی‌دە گێرێت وتەماشای ئەکتەروبینەران دەکات »).**
**قرقاش** :ئەرێ لە ئێوە ئەپرسم
ئەو کەسانەی لەم هۆڵەدا دانیشتون
چی‌بکەین ئەگەر هشك بۆ ئەم بیرە ..؟
لە بەر قرچەو گرِەی هاوین
ئەوسا چی بکەین ..؟
**جوتیاری شورِشگێر : ( «بەتوندی » )**
لێ دەدەین .. دەکۆڵین
جەرگی قولاّیی زەمین دەدرێنین
بۆ بیرەکی‌تر ئەگەرێین .
**قرقاش : ( « بە تورِەیی »)**
ئێمە چون خۆمان گورج کەین‌و بچینە
ناوقولاّیی زەمین ..
تازە بۆبیرەکی تر بگەرێین ..؟
**جوتیاری شورِشگێر :**
پەلك و تێوکلی‌و شەکانی خوت بشکێنە
کاکڵەی تووی بیرە کانتمان بۆ دەربێنە

**قرقاش** : (« بە ئەنگوستەکانی ئیشارەتی بۆ چاوکانی دەکات و دەڵێت : » )

گەر ئەم چاوانەم غەدرم لێ نەکەن
بەتیلاکانیان بەژنی پیاوان دەبینم
ئەگەر دەروونم پاك بێ و پرشنگ بپژێنێ
گیانێکی بە هێزو هەستێکی تیژتان
بۆبانگ دەکەم .. وەرن
وەرن خوای جەنگ بانگ کەین

**( ئیشارەتی بۆ جوتیاری شۆڕشگێڕ دەکات و بە تیزو قەشمەرییەوە ) .**

**دەڵێت** : نا ... نا .. ئەی خودای جادوکەران
باهنگاومان راتەکێنین .. کەندری برسیایەتی
بابێنە خوار لەسەر ئاسوی نەخوشی یەتی
دەستمان پڕ کەین لە چاکەوبوون
بەرەورەوەی بەرەو پێش چوون
بگەینە گشت ئاواتەکان

**جوتیاری شۆڕشگێر** :
**( « مەبەستی ڕاپەرینی جوتیارانە » )**
ئەی برایان .. خوشەویستان
تادەسکەوتی قرقاش زۆربێ
دەبێ بەشی ئیمەکەمبێ .

**( « حالی جوتیاران شەپرزەدەبێ .. تەماشای یەکتردەکەن بەڵام ناتوانن هیچ ڕێگایەك بدوزنەوە » )**
**( قرقاش لێ یان مۆڕ دەبێتەوەو دەڵێت » )**

**قرقاش** : دەترسن ..؟
لەچی دەترسن ..؟ لە کێ دەترسن ؟
ئەگەر ئەنگو بۆ تێکدانی ئاستەنگ هەڵسن
گەر شەمشیری باپیرانتان هەڵبکێشن
بۆ ئەوانەی لە ناوپێستی خویاندا رزیون

هەستن .. تا ولاتمان بکەینە .
قەلا بۆ نەتەوەمان و
قەبر بۆ دوژمنمان و
بیکەینە دادگای زەمانمان
------
لە مردنی پێش دوژمنان مەترسن
بۆوا بێ دەنگ و حەپەساون
کێ ئالای دەستی خۆمم شەکاندەوە
پێ دەخەینە سەر سەنگەری دوژمنان
------
کەسێك هەیە لە ناوتانا .. بترسێت ..؟؟
**جوتیارك** : کەس نی یە .. کەس نی یە ..!
**ئەوانەتر** : ئالامان داوەبە تو
تۆ بەرزت کردوتەوەو
بەرزی هەر بۆ تۆیە

**جوتیاری شۆڕشگێر** : ( « بە تورەیی » )
من دەترسم .. تێبگەن بۆ دەترسم ..!
پاشان پەشیمان دەبنەوە
دەڵێ : ئەنگوتان تێردەکا
بەلام هەر برسیتانە
دەڵێ خوشیتان فێر دەکا
کەچی سەنگەر قەبرتانە
دەڵێ : گشت تان رزگار دەکەم
بەلام مردن دەبارێنێ
داهاتی خستوتەدەست تان
بەلام تەنیا هەربە قسە
راوەستانتان ئاشتی یەو
لەژێر ئالای ئەودا نی یە
لەرەگەزی ئێوەنی یە

خۆتانی لێ بپارێزن .. تێیه گەن مەخەلەتێن ئەگەر قسەی من وەرنەگرن
دوایی پەشیمان دەبنەوە
**(« جوتیارەکان تەماشای یەکتردەکەن ولە نێوانیانـدا ئـاخوتن زۆر دەبێ و پیاوەماقولەکان دەوری قرقاش دەگرن » )**
**قرقاش** : ئەی میللەت .. ئەی خوشەویستانی من
ئالآی من وقەلاتی من
دیارە .. لە ناورێزەکانتان
سەری ماری پڕ ژار هەیە ؟؟
**(« لە دەرەوەی شانۆ دەنگی هەنگاوی گرانی پیاوێك دێت بە ئاوازێکی گڕو گۆرانی نارێك دەڵێ :) .**
**دز** :**دزم دزم هەتا ماوم**
**هەر دەمینێم ونامرم**
**من برسیم ومالی دراوسێ پڕ لەنان ..**
**( « دێتە ناو شانو .. کیسەکەی سە شانی بەزەوی دا دەداوبە بلندیو دڕ وندەیی پێ دەکەنێ .. گەلێك ماندوو دیارە » )**
**قرقاش** : لەکوێی هاتوی ..؟
جی لە ناو کیسەکەت دایە ..؟
**دز** : پڕە لە نان .. پڕەلە گوشت و .. پڕ لە زێڕ ..!
**( «پێ دەکەنێ و ناوچاوانی خۆی بە قۆڵی کراسەکەی پاکژ دەکا »)**
**دز** : گەلێ شتی خۆش وپڕ بەهام پێیە
**قرقاش** : چاکە .. چاکە .. ولآمی پرسیارم بدە
لە کوێ هاتی ..
**دز** : **(« پێ دەکەنێ وبە ئاوازە وە دەلێت » )**
دزم .. دزم هەتاماوم
هەردەمینێم ونامرم
من برسیمەو .. مالی دراوسێ پڕ لە نان
**جوتیاری شورشکێر** : نانی دراوسێ حەلآلە
بۆئەوەی لەدەرگای بدات
بەلآم حەرامە .. بۆئەوەی دزی بکات ..
**(« تەماشای دەوروبەری دەکات » )**

ئەی خەڵکینە .. خاکە کەمان میهرەبانە
بەشی داوا کاران دەدا
بەرهەم دەدا بە کرێکاران
گەر کاربکە ن

ئەی خەڵکینە .. خاکەکەمان میهرەبانە
رووتکرن وتالآن تاوانە
وەرن بخازین لە زەمین .. ئەوزەمینەی دایکمانە
گەر دەستمان کڕنوش نەبا بۆ تەور
گوڵی گەنم سەر دانانەوێنێ بۆداس

**قرقاش** : (« ئاخوتنی دەبڕێت »)
ئەی برایان .. چیتان دەوێ باوا بکەین
زەمین هیشك وشۆرە کاتە ..
چی بکەین باشە ..؟
لەولای سنوورماندا هەیە
مێرگە کی مەزن ورووبارویکی بێ سوود
دراوسی یەکان .. دوژمنمانن
باری گرانیان هاویشتوتە سەر شانمام
چیتان بێ بلێم باوا بکەین
شەمشیرەکانتان دەرکێشن
بەهێزی من.. خۆ ئازاکەن
رێزەکانتان پاك کەنەوە .. لەترسنوك وخایئنان
ئەوانەی ئاگری ئاکۆکی هەڵدەکە ن ..!

**(« بە وێنەیەکی شێتانە تەماشای جوتیاری شوڕشگێر دەکە ن» )**

**جوتیاری شوڕشگێر** : ئەی خەلکینە چاوتان ڤەکەن
قاتلی من خۆی دەکوژێ

**قرقاش** : دەی بۆچی چاوەڕێ دەکەن
سەرکەوتن چاوەڕێی ناوێ
بالاشەکەی بکەینەبوار
بەسەریدا سەر بکەوین ..

**جوتیارە ك** : با بکوژ رێت ..!

**جوتیارەك** : بەردە باران بکرێت .

**( «روناکی دەکوژێتەوە لەگەڵ هێرش بردنی هەموویان بۆ سەر جوتیاری شوڕشگێربە چەقوو خەنجەر وئەوژی هاوار دەکا »)**

قاتلی من خۆی دەکوژێ ..!

**(« تابێ روح دەبێ .. شانۆ روناك دەبێتەوەبە روناکی یەکی کزو رەنگی ئاڵ ..»)**

**قرقاش** : ئەمجاوەرن .. دەی بابرۆین بۆ پێشەوە کەسەك هەیە درێغی بکا ..؟

**هەموویان**: نا .. نا .. کەس نی‌یە

ئالای ئێمە بە تووە بڵندە

**( « هاوار دەکەن »)**

بژی .. بژی ..بژی قرقاش

- پەردە

## - دیمەنی دووەم -

**( «قرقاش گەنمی خەڵك دەدورێت و ئاوی بیرەکانیان دەخواتەوە » )**

**( شانۆ بیابانەکە .. چەند درەختێکی شکاو .. سەربازان دەگەرێنەوەلە جەنگ .. دەسکەوت وتالأنیان هە ,لگرتوە ..**

**چەند زامدارو قۆل براووشەل وسەقەت لە گەڵیاندان چەند منداڵ وپیاووژن پێشوازی سەربازان دەکەن ولە کورو خزمە کانیان دەپرسن ودەگرین .» )**

**سەربازان** : **(« بە سروود دەڵێن »)**

ئەوسەربازە دڵیرانەی تۆ ئەی برسی

گەرانەوەلە هەلەتی پرمەترس

**کورس** : کوا ..؟ ئێمە نەگەراینەوە ..!

**سەربازان** : گەڕانەوە .. چاوەرێی وەرزەکان مەکەن

گەڕانەوە .. پڕ لە تالان ودەسکەوتان

**کورس** : **ئێمە هەرگیز ناگەرێینەوە .**

**سەر بازان** : بمان بەخشەئەی نیشتیمان .
گەلێك دەست ولاق خۆمان
گەلێك دەست ولاق وپێمان
فەرمانی توندمان پێدرابوو
(« قەدەغەیە گەڕانەوەی لا شەی مردوو »)
**کورس** : ئێمەنەگەڕانیەوە .. نەگەڕاینەوە
(« سپێدەی رۆژێکی هاوینی .. پەرێزەکی گەنمی پێگەیشتو .. چەند دارێکی لە یەك جودا دیارن . چەند جوتیارو پیاووژن ومناڵ دروونەیدەکەن بە شادی یەوە پیرەمێردەك رادەوستێ لە کاروئەیەوێ خۆی راست بکاتەوە .. دەستەکی بە تەینشتیەوە دەگرێت »)
**پیرە مێردە کە** : کەمێك پشوو بدەین ئێستا
کوزەی بێنە کچەکەم هەستە
**کچەکە** :دە .. ی با گۆرانی بڵێین .
زورناماان بۆلێدە وەستا
**گەنجێك** : بە شایی خۆمان شاد دەکەین
دەستمان بگرینە ناودەستە .
(« کچەکە ئیشارەتی بۆپیرەمێردەکەی دەکاوبەتیزو قەشمەری یەوە دەلێت .» )
**کچەکە** : پیرەمێران ئەبە خشین .
شایی نەکەن لە گەڵمان
( « هیندەکیان پێ دەکەنن وپیرە مێردەکە بە توندی و تورەیی هەڵدەستێ ودەلێت » )
**پیرە مێردەکە** :ـ بابزانین کێ بێ هێزە
من یائەو تۆتە لانە
( « چەند کەسێك پێ دەکەنێ » ):
وەرنە داوەت وشایی
وا قەل گۆرانی دەلێ ..!
( «هەمووپێ دەکەنن »)
**کچەکە** : کوتری جوانی ئەم دەشتە

گۆرانی دەلیّ وەك بلوێر
لاوان بۆی دەگێرنەوە
گویّ بگرە ئەی پیرەمێر
(« چەند کەسێك پیّ دەکەنن وگەنجێك شمشالّ لیّ دەدا لە گەل کچەکە گۆرانی دەلیّ و ئەوانەیتر شایی دەکەن »)
کچەکە : بەخێر بیّ ی ئەی گولیّ خویّن
خۆشەویستی پڕ برین
پڕبەدلّ خۆشم ویستی
لەیەکەم رۆژی ئەڤین
( «ئەوانەیتر لیّ ی دەگێرنەوە .. پاشان دوو بارە بە تەنها دەلێت »( .
تامی شیعرانی لیّدێن لێوەکانم
مێوەی ئاگرینە گەرمای ڤیانم
دلۆپی فرمێسکم دانەی مروارین
وەك کرانەوەی قەلشی هەنارن
لەکاتی سپێدەدا .. لەبیر دەکەین زامەکانمان
گۆرانی دەلّێین لە سەر خەمان
بە خێر بیّ ی ئەی گولیّ خویّن
خۆشەویستی پڕ برین
پڕبە دلّ خوشم ویستی .
لەیەکەم رۆژی ئەڤین
وابوینە خزم وپێکەوە دەژین
(« هەموویان پێکەوە گۆرانی دەلّێن ، دەنگی هەرایەك لە دەرەوەی شانۆدێت .. هەموویان کردەین تـەماشـای ئەو لاوئـەو لادەکە ن.. « قرقاش » دێتە ژوریّ کەرەستەی راوی پیّ یە لەگەلّ چەند سەربازو هاوریّیە کانی وگەنجێکی جوانیش یان لەگەلد یە « کوری قرقاش » ە جوتیاران لە ترسان سەریان دادەنوێنن وکرنوش دەبەن )

قرقاش : (« بەتورەیی » ) چون گۆرانی ئەلێن ..؟ من لە راوم !
بلێن بۆ ..؟
درونده کان دەترسن

**پەرندە کان دەلەرزن**
**لەبەر گۆرانی گوتنی ئەنگو**
**(« بە تورەیی تەماشای کچەکەی دەکاو دەلێت »)**
**گوێم لە گۆرانی تۆ بۆ ئەی نەزان**
بەناوی خۆم وناوی ولاتمان
**قەدەغەیە گۆرانی گوتن .. ها !**
**قەدەغەیە .. هەتا .. هەتا ..!**
**هەر سروودی شەمشیرو بلندانە**
**دەبێتە سروودی ئەم نیشتیمانە**
باش گوێتان لێبی ..!
**(« بە دەنگێکی ناخوش ونەشاز سرود دەلێ » )**
ئەمە فەرمانی منە ئیمرۆلە ناوا
ئەبێ ببێتە بەندێك لەیاسا
هەموو کارێك رادەوستێنن
شارەکان بخەملێنن وبرازێنن
**پەنجەرەکانی ولاتە نەمرەکەم**
**دلی زیندەوەرەکان پڕ بێ لە شادی**
**لە کاتێ .. فەرمانی شاهانەم**

**پاو رانی گە بۆ جێ ...**

**یاگەڕان بە دوای دەرهێنانی پاشماوە کۆنە کا    سایەکە**
**« پێ دا دەچێت ودەلێت » :**
**هەمو و گۆرانی گوتنی نەزانەکان .. قەدەغە .ە کرێن**
**ولاتە شارستانی یەکان ...**
**گۆرانی بۆ شەمشیری تیژ دەلێن**
**( «بەقەشمەری‌یە وە»)**
نەك بە کێماسی داس وهینجاری بێ بە هاو
نیگاهەکانی ساردو بێ قیمەت .
**(« قرقاش دەروانە دەرەوە لەگەل هاوری‌یەکانی .. لاوی گەنج دەمێنتە وەو خۆی نیزیکی کچەکەدەکات وچانەی بە ئەنگوستی بلند دەکات وسەری بەرز دەکاتەوە »**

**میر « کوڕی قرقاش » .**

**هەستەئەی بۆکی نێرگزان**

**(« تەماشای ئەوانی تر دەکاو ئیشارەتیان دەداتێ »)**

ـ هەستن ئەی خزمانی ئەو

**( «ناوێرن هەستنەوە .. پێ یان دەڵێت بە شادی یەوە »)**

ـ منم کوڕی شاهی پایە بەرز

هەستن ، هەستن ومەترسن

**(« پێکەوە هێدی هێدی هەڵدەستن »)**

**میر** : پێم ناخوشە ئازار زۆربێ

جوانی یەکان ژی بێ بایەخ بن

پێم ناخوشە .. پێم ناخوشە

لێم ببورن هەرچی بووە .. ئەی براهەژارەکان رازی ببن بە هاوری یەتیم .

(« خەڵکەکەبە شەپرزەیی‌وە تەماشای یەکتر دەکەن .. شازادە « میر » روو وەردەگێریتەوەلای کچەکەی کەلە حالەتی هەراسان وشەرمینی یەوە دایە » )

میر : لەوکاتەوە .. گویم لە گۆرانیت بۆ

ئەی کچی چاکی داوێن پاك ..

دلم کەوتە پەلە قاژە

بزوت وەکو چولە کەیەك

لە قەفەسی زێرینمدا

بادەستەکانم بگرن ..

ئەو جوانی یەی خەلك راکێش دەکا

ئەی گولی قەد پالی چیا

شین‌بووی لەدەم کانی وچیمەنی رازاوەی خوا

پەرستگای پاکی تو قەبولم کاخونچە جوانەکەم

باپاڕانەوەی ئەڤینم بەرزبێتەوە

بەبەر دەمی خوای داهاتوی زەمین

------

ماوەم دەوێ روخێنەری ناوەکان

**( «کچەکە سەری بەرزەکاتەوەوبە چاوی پڕ فرمێسک بەلەرزو ترسەوە تەماشای میر دەکا » )**

**کچەکە** : قوربان .. گەورەم

ئەی خاوەنی شەمشێر .. فەرمانرەوای من
گولی کێوی بۆ کۆختە کان
رازاندوە خوای هەژاری
لە شەوی رەشی هەتا هەتایی دا
نەیدا بە کۆشکە بەرزەکان
بە دەستی خوای بەرزەکاری
لە رۆژانی سپی هەتا هەتایی دا

------

ئەی شای گەنم وگولاّ لەکان
شەمشێر وپاسەوانی من
خوزکا بمزانیبا .. رێگای جادووکەرانی دوور
ئەوانەی لە ولاّتە دوورەکان دەژین
دەستەکانم پێ دەگۆڕین
بەدوو باڵی سپی ورەنگین
تابەیانی زووبەرزئەبو
دە فری لەشی تامەزروی من
لە خانوە قوڕینە کەمەوە
بۆ بەرزایی کۆشکەکەی تۆ

**میر : کۆشکەکان وا کڕانوش دەبەن**
**کۆختەکانژی بەرزدەبنەوە**
**تابێك بکەن .. تۆو خۆرۆڤیانی من**
**ئەی جوزەرەی گو لی نێرگز**
**(« کچەکە هەر وەك لەخەون دایە »)**

قوربان .. گەورەم
کەتارمایی خەون دادێ
خەیاڵ دەست دەکا بەگەڕان
کەتارمایی خەو ن داهات

دێم وبەری پێت ماچ دەکەم
وەك پەروانەی بیابانی ئەفسانەکان
کەتارمایی خەون دادێ
فەرمان بدە ، دو ات دەکەوم .. تادەریای تاریکستان
بەهەموو دور گەو جەزیرە کاندا بگەرێم
بەچیای روانگەی ئەژدەهاکاندا هەلگەرێم
ببمەسایەی پێ یەکانت

**( « بەلێوە لەرزەوە لە « میر » دو ور دەکەو ,یتە وە لەگەڵ خـزم و کەسەکانی دەچێتە دەرەوەی شانو » ) .**

ـ قوربان .. گەورە م

( «میـرتەمـاشای دەکـات تالە شـانـۆدەردەچێت . رادەوشێت پـاشـان بەشەپرزەیی دیت ودەچیت کەدەستەکانی لە پشتـەوە یەکیـان گرتـوە و پاشان لەسەر بەرێك نیزیك درەختێك دادەنیشێ » )

میر : (« بە سرووودو گۆرانی یەوە » )

**دوورم من . خوشەویستەکەم .. دوورم**
**خاوەنی قەسری پڕ زێری سورم**
**پێم خوشە خوشە مردن لە سایەی ئەودا**
**پیم هیچەقەسرو هەرچی یەکی تێدا**
**دوورم ئەمن .. دوورم ئەمن**
**دەنگی تۆزۆر بڕندەیە .. هەمو شتێکی ئەبڕێ**
**چاوەکانت کانی خەمن . چاوەکانت وەك گێژنن**
**چاوەکانت بەیانی شەوی رابردوون**
**چاوەکانت مەرگی منن**
**چاوەکانت هەستانەوەی تازە ی من**
**دوورم ئەمن .. دوورم ئەمن**
**من دەزانم خوێنی من فرمێسکی تۆیە**
**خواردن وگوڵزاری من .. سروودی برسی یەتی تۆیە**
**مەمبەخشە .. نا .. نا .. مەمبەخشە**
**هەتالە بەر چاوەکانا پاك ئەبمەوە**
**نێزیکم مەبە . تابە چاکی پاك نەبمەوە .**

(« لەو کـاتەداوەزیـرەکی ریشـدار دێتـە نـاوشـانـۆ . شـەپـرزەو ونارەحەت . وبەغار . کە « میر » دەبینێ رادەوەستیو هەناسـەی هەڵدەمژیو هەست بەخوشی دەکا .. میر وا دیاردەبی هـەر وەك لە خەونێکی دوور ودێژ هـەلستابێ ) وەزیـر : (« بە شێـوەیەکی پـڕ گللەیی »)

گەوررەم ..

نەم دیوە من .. تاتەمەنی پیری ئێستام
مانگ بە تەنیاتریفەدار بێ
ئەستێرە کان لە چوار دەوری پرشەنگ نەدەن
یان جێگیری تەختی شاهی
سوارێکی زۆر لە سایەیا تیپ تیپ نەروون
گەر جەنابت فەر مانێکت دەرکردبا
سەربازەکانت ریز دەبوون
پتەو وەك دیواری ئاشتی
شەپرزە نەدەبوو میللەت لە مەترسی بزربوونت
هەر وەك دەزانی گەورەیمن
جەنگەل بێ درِوندەی گوشت خۆر نابێت
یان نەزانێکی پیاو خەراپ
لە بەر ئەوە هاتمو .. زۆر بە گۆڕ هاتم
دڵم لە پێش لاشەم گەیشت
بۆدوزینەوەی زاتی شاهانەت
لەم بیابانِ ودۆلی درێژ دەگەرام
میر :بیابان ودولی درێژ ..؟
بیابانی چی ....؟! ( «بەتورەیی وە »)
بەسینکمدا نەبەخوارێ
دودانی وشەی ژەهراویت
وەزیر : ( بەشەپرزەیی وە » )
گەورەم بمبەخشە .. قوربان بمبەخشە

کلۆ لێکی بیچوی خاکی وەکوبەندە

چون دەگاتە رازی ژیری .. وەکوئێوە
**میر** : ( **«بە ئارامی‌یەکی شەپرزەوە »**)
باشە .. چاکی تێبگە رازی راستی
ئیمرو هەموو شورەکانی قەلای تاریکی روخان
ئیمرو توانیم روخساری خۆ بە چاکی بە چاوببینم
( **«بێ دەنگ دەبێ »**)
**ئیمرو خوای خۆشەویستی نەمر**
**دڵ و رێگای روناك کردم**
**وەزیر** : (**« خۆی بە شادی نیشان دەدا »**)
وەی لەم موژدەیە .. وەی لەم موژدەیە
دەسا باشاری روناکی
دەرگای مێژ وبە دەهوڵی شادی بکوتێ
ئەی قەلایەکانێ وریالە سەرانسەری جیهاندا
لێدەن زەنگی زێری شادی
( **« بەدەنگێکی کێم وئارامی ئەیەوێ زیاتر بزانێت و دەلێت »** )
کێیە ئەو شازادە جوانە ؟
**میر** : ( **«بە گالتەوە »**)
بلی کێیە ئەو جوانە نەناسرا وە ..؟
کێ یەئەو شوخە هەژارە ..؟
خوشەویستەکە م .. سەرداری دلەکەم
گوڵالەی سپی لوتکەی بەفرینم
کیژێکی ئەم میللەتە هەژارەیە
لەکاتی گۆرانی وتنا .. دیتم وباوەرم پێ‌کرد
**وەزیر** : (**« بە شەپر زەیی وحەپەساویی‌وە »**)
**بەلام .. بەلام گەورەم**
**میر** : (**« ئاخوتنی دەبری »**)
**پێم گوتی شورەکانی تاریکی روخان**
**توانیم روخسارم ببینم**
**وەزیر** : ( **« بە ناراحەتی‌وە »** )
**بەلام خاوەن شکۆ قەدەغەی کردوە**

جگەلە روخساری پیروزی ئەو
هیچ شتێکی تربیینین ..!
**میر** : ( **«بەتەحەددی و بلندی یەوە »** )
ئەو روژەی من دەبم بە خاوەن شکو
تو دەتوانی روخساری من نەناسیوە
**وەزیر** : ( **« تەئکیدی قسەکانی دە کات»** )
لەور وژەدا روخساری تۆ
پرشکۆترین روخسارەو دەیناسمەوە
**(« بێ دەنگی »)**
فەرمان بدەو . بلێم بەلێ
**میر** : دەروونی فراواندا
رێگای رازان دەپشکنی
ئالاکانی چالاکی‌یە و .. بەجادوویی دەکرێتەوە
تادە ربچێ لەناوماندا .. دروشمەکانی ناکوکی
گولێ رازاوە بشنێ .. لەبەر دەمی پاشە روژا
**وەزیر** :**(« بەمونافقی یەوە »)**
فەرمانی شاهانەت چی‌بێ
لە سەر سەرەو لە سەر چاوە
مێزێکی خاوەن شکۆ دەبم . لە ولاتی نەزانراوا
ئەو ولاتەی کەس نایزانی جگەلە بیری روناکم
ئەوبیرانەی لە روناکی تەمەنی خۆم دەسکەوتوە
چاکەدەبێ .. باشی دێنێ
بۆ گەورەیی پر شکۆمان
بۆتۆو بۆ ئێمە هەموومان
بۆتەختی شاهانەی ولات
کەچواردەوری فریشتەی پیروز گوتویە
**(« تەماشای ئەو جێگایەدەکات کەتیا هاتی بەشەپرزەیی » )**
**ئێستاش فەرمۆ بابگەینە مەوکبی خاوەن شکۆمان**
**( « دەستی بەئەستوویەوە دەگریت ودەلێت » )**
گەر حەز بکەی لەسەر سەرم
شایی وزەماوەند بگێرێ

## « دیمەنی سێیەم »

**( دوو پیاوی سەرو چاوپێچایی دێنە .. ناوشانۆ ..**
**لافیتەیەکیان بە دەستەوە .. لەسەری نوسراوە »)**
**(« جەماوەر کاتێك هەست بەچەقودەکا کە گوشتی لێ بکاتەوە .. ئەوسا ماوەی بیر کردنەوەیان نامێنێ چی بکەن .. گەربیانەوێ ژیان دەست پێ بکەنەوە »)**
**( شانۆ هۆڵەکی گەورەیە لە ناوەندیدا تەختی سولطانەو مێزەکی مەزن لە پشتەوە .. تەرازوی داد بەسەر دیوارەوە هەلواسراوە لەگەڵ روزنامەیەك .. قرقاش تەماشای خۆی دەکات لە ئاوێنە یەکی مەزندا . دەستی بەشەمشیرەکەیەوە دنیت ودەبات .. دووسەر باز خەریکی پاککردنەوەی نیشانو پێلاو جلەکانی دەبن لە پر دووریان دەخاتەوەو بە هەوارەوە دەلێت :)**

**قرقاش** : ئیمرو رۆژی یاساو دادە
باکاتمان بەفیرۆنەچێ
کوا سەربری دەست بە خوێن .؟
کوانێ کتێبی یاسا
لە کۆین تاوان بارەکان
بابێن .. وەرن .. ئیمرو روژی یاساو دادە

**(« هەر دووسەر باز سلاوی سەربازی دەکەن وبەغار دەردەچن وهاوار دەکە ن» )**

**سەربازەکان** : بە دادەوەو بەتەرازو
گەورەمان .. کوڕی خۆر ..
خودای ژیری .. بانگتان دەکا

وەرن .. وەرن ئەی خەلکینە
خوشەویستی لیٚ وەربگرن

**( « قرقاش لەسەر تەختی سەلتەنـەت دادەنیشیٚو صەولەجـانێکی مەزن بەدەستی راستەوەیە .. چەندپیاوێکی ماقـول دێنە ژوریٚ .. زەوی بەر پێی ماچ دەکەن لە**

**دەروبەری دادەنیشن .. چەند سەربازدێنە ژوریٚ .. بە رێوە چوونی توندی عەسکەری ، وێنەی تەرازوی داد دەکەوێنە خوارەوەو هیچ کەس گویٚ نادەنیٚ وئاگای لیٚ نابیٚ » )**

**قرقاش** :بەناوی ئەودادە گەورەی
لە خوای بروسکو هەورەوە
بوٚ ئێمەبە جیٚ ماوە

ئەم دانیشتنە مان دەکەینەوە

**( « پیاوێکی ماقول رووی وەردەگێریتە سەربازێك کە نێزیکی دەرگا وەستاوە » )**

**دەرگەوان** : تاوان باری یەکەم بانگ کە .

**دەرگەوان** : پاوێژنە زوٚرئەوەی نرخی چاکەی شاهانە نازانێت
باله بەر دەمی دادپەر وەری گەورەماندا ئامادەبیت

**(« سەر بازێك دێتە ژوٚر ژنێکی کورٍکوژ راوی داوەتە پێش و فرەیٚ دەداتە ناوەندی شانو » )**

**پیاوی ماقول** : (**« لە بەرگی تاوانباری »)**
ئەم هیچە بەختەوەر نەبووە
شەهید بدا بە گەورەمان
لەور وٚژەدا هێرشمان برد
بوٚدرو ونەوەی گەنم ودەغل ..
لەناو خاکی دوژمنانمان

**(« ژنەکە هەلدەستێتەوە سەر ئەجنوو هاوار دەکا بەدەم وچـاوی پیاوی ما قولدا .. » )**

**ژنەکە** : بوٚ ئەوەتان هێرش نەبرد
دلی زەوی بەکالاٚ کەن
بوٚ ئەوەتان هێرش نەبرد

ئاژەڵی برسی قەڵەوکەن
بۆ ئەوەتان هێرش نەبرد
منداڵ لە باوشا بنوێ
نەتان هێشتوە تاقانەکەم
ڕوومەت لەسەر سینگم دانێ
کردتانە پارچەیەك ئاسن
ئینجا بوتان هێنامەوە .
**(« ژنەکە بەتوندی دەگرێت .. قرقاش پێکەنینەکی بڵند دەکاو بەتیزەوە دەڵێت :)**
**قرقاش** : لە کوێ فێری ئەم خەمە بوی
ئەی کچی خائینی نەزان
لەچێ وڵاتێ ئەمەبووە
کەسێك هەرچی بی یەوێ بیکا
**(« بە تورەیی تەماشای یەکەك لە پیاوە ماقولەکان دەکات »)**
لەم ساتەوە لەم ڕوژەوە
توم کردوّتە وەزیری خەم
تاخەم بخوی لەجێی میللەت
نەوەك ئەژ دەهای ئاژاوە
سەری خوّی بەرزکاتەوە
**( «ئیشارەتی بوّژنەکەی دەکاو لە بەرزی‌یەوە تەماشای دەکا » )**
ئەو ژنە شمان حوکم داوە بە ڕاوەستان
هەتا شەش ڕوّژ لە سەر یەك لاق
لەنیوە شەو ونیوە ڕوّان
لە ڕێگای کانی یەکانەوە
پێش تەواو بوونی شەش ڕوّژان
ئەبێ حەوت منداڵ بزێ
هەفتەمینیان ئەبێ بچێت بوّ سەر بازی
شەشەکانی‌تر ..! ئەوان ژی هەربوّ سەربازی
(« دەمی دەبەستن ودەرد یّختە دەرەوەو دەنگێك لە دەرەوەی شانوّ :
داوای گەورەی خوّمان دەکەین

تەشریف بهێنێ بۆ خواردن

**( «قرقاش ئیشارەتی بۆ سەر بازێك دەکا بەبێ ئەوەی ببینێ »)**

**قرقاش** : لە جێگای من باری دادبەخشی هەلگرە
تا دووبارە ورشەی دادم
لەم هۆڵەدا دەدرەوشێتەوە .

**(« هەموویان هەڵدەستن وقرقاش دەردەچێ لەسەر ئاوازی موسیقای نارێك سەر بازەکە لە وەستاندا دەمێنێتەوەوتەماشای ئەو لائەولا دەکات .. دەستی بەرزئەکاتەوە بۆئاسمان ولەسەر کورسی داد دادەنیشی :ـ**

**سەر باز** : بە ناوی دادو گەورەمان
لەتاوانی تاوانباری دووەم دەپرسین

**دەرگەوان** : تاوانباری دووەم بابێ

**(« سەر بازێك پالی بە جوتیارێکی پیرەمێردەوە دەنێ و دینێتە ناوشانو .. جوتیارەکە کونوش دەباو لە ترسان دەلەرزێ »)**

**سەر باز** : ئارام بەو مەترسە مامە
پێمان بلێ خەتات کامە
من کتێبە کانی یاسام نەخوێندوتەوە
بەلام دادی نەزان ئەتوانی
زۆلت لێ دوور خاتەوە .

**جوتیار** : **(« برەك ئارام دەبێ »)**
ئەی دادراگەری زەمان
کاتێ بۆ جەنگ چوون کورەکان
پەلە گەنمی منیان شکاند عارەبانەکان
دارو درەخت بە نالی ئەسپ شکان
درێژی نەکە م.. دادگەری زەمان
دوو دلۆپە فرمێسکم هەوەراند
بۆ خەم وپەژارەکەی دوێنێ
یەکەمیان بۆ کورەکەم کە لەگەڵ سەر بازان رویشت
دووەمیان بۆ ئەو رۆژەی رویشت و
بانگ کرد دەرگای مالمان

ئەرێ دەگەرێتەوە ..؟؟

وەڵام داوە بە دەرگاکەمان

ناگەرێتەوە .. ناگەرێتەوە

**( «سەری دادەنەوێنێ ودەلەرزێ » )**

**سەرباز** : **(« بە توندی رادەپەرێ »)**

ئەزانین کەبەندی یاساکانی میری
بریاری لە داردانی تۆی دەدا
بەلام دادی نەزان فەرمان دەدا
ئەبێ لە مالی دەولەت وەربگری
ئەوەندەی پێی بەرێ بچێو
تولەی کشت وکالی لە ناوچووت بکاتەوە
بەرەورەوەی جەنگ و .. بە نالی ئەسپی سەربازان
داد لە رژێمی نەزاناندا دەلێ
خەم بۆکورت حەقی تۆیە
نەك ئی وەزیرەکە خەم بخوات
فرمێسکی خۆی لە سەر کاغەر برژێنێ
لە بەر ئەوە من ئەزانم

مێژووی باپیران نازانم

جوغرافیای ولاتان نازانم
حوکم ئەدەم .. تو لە سەر حەقی

**(« جوتیارە کە ئەیەوێ دەست وپێی سەر بازەکە ماچ کە ، ئەو بەتورەیی » )**

**ئەلێت** : گەر کشتو کالت نەبایە
هیچ پێویستی نەبو بۆ ئێرە بهاتایە
هەستە بۆگێلکەکەت بگەرێوە
ئەم قسانەم بۆ خەلك بگێرە وە

**(« جوتیارەکە دەردەچێ ... دانیشتوانی ناو شانو سەرسور دەمێننەوە . پیاو ما قولە کان تورەدەبن .. دەنگی موسیقای نارێك دێت وقرقاش دێتە ژورێ بە توندی وەك رەشەبا »)**

**قرقاش** : **چەند کەسی دی بەختەوەر بوون بە لە سیدارەدان ؟**

**( پیاو ماقولەك هەلدە ستێ‌وهاوار دەكاو ئیشارەت بۆ سەرباز**
**دەكا** ؛ ئەو سەر بازە نەناسراوە
هەژاری بێ‌نرخی بەرداوە
لە دژی یاسا جولاوە
ئەبێ لە سێدارە بدرێت
**پیاویكی ماقو لی تر** : ئەبێ لە سێدارە بدرێت
**قرقاش** : **(« بەقەشمەری یەوە ») لەسیدارە بدرێت وبسوتێنرێت**
**پیاوێكی ماقو لی‌تر** : **چاكەبێنن .. سیدارە چاوەروانە**



## « دیمەنی چوارەم »

(دوو کەس دێنە ژوور سێدارەیان بەدەستەوەیە لە ناوەندی شانـو دادەنێن .. کورسیەك لە بندا دادەنێن .. دوو پیاوی ماقول هێرش دەبەنە سەر سەر بازەکەیودەمی . دەبەستن بەلام ئـەو بەربــەرە کانیـان دەکاو هاوار دەکا .. پالی پێوەدەنێن بۆ سەر کورسیەکەی .. رووناکی نامێنێ لەو کاتەدا دەنگی کـەوتنی شتێکی گرانبـە سەر زەویدا دێت .. روناکی دێتەوە سیدارەو پیاوەکەنەماینە » )

**پیاو ماقوڵەك** : **تاوان باری دیکە بێنە دەرگەوان**

**دەرگەوان** : تاوان باروپیسی تر بابێت

**(«سەربازەك دێتە ژوری پیاوێکی دەست بەستی بە گوریس بەدوای خۆیدا دەکێشێ » )**

**پیاوی ماقول** : قوربان ئەمە پیاوێکی نێرە مووکە
پێنج ژنمان بۆ هێناوە
هیچ منالی نەبووە شەمشیر بۆ تۆ هەلگرێت
ئەبێ لەبەر ئەو بەختە رەشەی خۆی
سزای ئەو نەزوکی یە بدات
لەو کاتەی دوژ من زۆر دەبن

**قرقاش** : (**« بە پیاوە ما قوڵە کەی دەڵێ »**)
دادو دادکاری مەعیدەم تێکدەدا
تۆ بە ناوی من حوکم بکا
تا گەورەیی زك پڕبوون

یارمەتیم بدا .. بەڵکوبرسی ببم ..!

**پیاوی ماقوڵ** : چاکە .. ئەبێ لە سێدارە بدرێت

سێدارەی چاوەروان بابێت

**(« دیمەنی ئێنانی سێدارە دووبارە دەکرێتەوەو تاوانبارەکە نێزیکی سێدارە دەکرێت بەڵام ئەستوی ناگەهیتە گوریسی سێدارەو ئەو پیاوە ماقوڵەی حوکمی دای دەڵێت :»)**

**پیاوی ماقوڵ** : ملی تاوانبار ناگاتە گوریس

چی دەفەرمووی قوربان

**قرقاش** : چاکە .. کێ لەئێوە .. لەو درێژترە

**(« تەماشای دەوروبەری دەکات وپاشان نیگای بە پیاو ماقولە کەی دەوستێت وەلێت : »)**

**قرقاش** : مادام کارەکە وای لێ هات .. خۆت تاقی کەوە ..!

**(« ترس ولەرزلە دەم وچاوی پیاوە ماقو,لە کەی دیاردەبن‌و هیچ جوڵانەوەی ناکات »)**

**قرقاش** : گوێت لە فەرمانم نەبوو

زووبە خۆت تاقی کەوە

بۆپێشەوە . بۆ پێشەوە

ئەبێ ئێمە حوکمان بە جێ بینین

لە سەر هەر کەسێك دا بێت .

**(« پیاوی ماقوڵ دەچتە بەرامبەر سیدارەو گوریس نێزیکی ئەستوی دەبێت زیاتر دەلەرزێت وقرقاش دێت بە صەولەجانەکەی دەکاتە ئەستوی پیاوە ماقوڵەکەیدا » )**

**قرقاش** : ئەوە شتێکی زۆر بە جێیە

**(« تەماشای دەوروبەری دەکات»)**

چەند چاکە لەشێکی وا پاك

شۆ ببێتەوە بەم گوریسەدا

ئەوەشتێکی زۆر بە جێیە ..

وانی یە ..؟؟

**هەموویان** : وایەقوربان .. وایە قوربان

**(« قرقاش ئیشارەتی بە صەوڵە جانەکەی دەدات .. روناکی نامینێت**

دەنگی بەربوونەوەی شتێك بەزەوی دێت ، لە کاتی هاتنەوەی روناکی هیچ کەس لە شانودا نامێنیّ جگە لە قرقاش خۆی کە راکشاوە سەر عەرشەکەی .. ئەو وەزیرە ریشدارەی بۆ پشکنینی ڤیانی کوری قرقاش وکچی میللەت چۆبۆ دێتە ژوریّ کەچی قرقاش هیچ گرینگی یەکی پێ نادات .. وەزیر هێدی هێدی خۆی نێزیکی قرقاش دەکات »)

**وەزیر** : ببورە قوربان گەر ئارامیم تێکداو
هاتمە ناو خەونە خۆشە کانت
تورە مەبە گەر زەمینی تاوانم
گران کرد بە گرانی خەمان
**(« بە تەرەدودەوە »)**
هەوا لێکی گەلێك بە نرخم لە لایە
باسی دەروونی پاك وناپاکە ..
ماوەم بدە .. ئیزنم بدە
**قرقاش** : **(« قسەی دەبڕیّ »)**
بەسە بلیّ .. دلّم گوشرا
لەگەلّ هەموو داوی ئێمە
کام خەنجەرو کام ئەژدەها
لەناو دەرزیو وشەکانی
ئاوریشمی پڕ لەروناکی نە
**وەزیر** : ببەخشە قوربان .. چیروکم هیچ نی یە
دێوێکی تاوانبار دەری هێناوە
**قرقاش** : **(« بە تورەی یەوە » )**
بلیّ .. نەوەك شەمشیرم بدرەوشێتەوەو
بگاتە نێوان ریش وشانە کانت
**(« وەزیر ئەیەویّ قرقاشی ئارام بکات ودەستی بە ئەستوی یەوە دەگرێت وبە ترسەوە دەلێت :»)**
**وەزیر** : چاکە .. چاکە قوربان ..! **(« بەشیوەی خەون »)**
چیروکەکی مەملەکە تێکی کۆنی لە ناو چوو
چیروکەکە دەلێت :ـ
شازادەیەك لەو ولاّتە کۆنە

کچێکی هەژاری ناو میللەتی ڤیا
بەڵام باوکی .. شاهی توانا
خوایانی خەم وئاگری هاندا
بۆ کوشتنی بلبلی ڤیان
کەچی تا پادیشاه لەشەری
خوداي خیرو بەرەکەت دووربێ
فەرمانی بە پاسەوانەکان دا
تائەو کچە عاشیقە نەناسراوە بکوژن
(« بە شێوەیەکی درامی »)
بەلام عاشیق خەنجەرەکەی دەرهێناو
لە ماوەیە کی کەم دا
دەمی خەنجەرو نیگای خوشەویستەکەی
برینەك لە ناوەراستی دلیدا پەیداکرد
(« دەگەرێتەوە بۆ خەونە کەی »
چیروکە کە پێدادە چێت ودەلێت
خەنجەرەکەی لە پاشانرا
بۆ بە داری ئازادی
و گوڵیدا
( «دەیەوێ وەزعێکی پڕ ترس وهەراسان دروستکا »)
چیروکەکە زیاتر پێدا دەچێت ودەلێت :
خودای خێرو خوشی سویندی خوارد
تۆڵەی ئەو ئەڤینە سەربڕاوە بستێنەوە
فەرمانیدا .
هەوران باڵ شووڕ کەنەوە
بە سەر ئەو ولاتە پڕ لە خەراپەدا
رەورەوەکانی توندی گڕەو هورە نە هێڵن
گوڵ وخوشی وشادی
لەو ولاتە پڕ دێوەدا بروێن
ئەو ولاتە ببێتە مەڵبەندی قەڵ وکوندەبو .
(« بە شێوەیە کی درامی بلند »)

روبارەکان هیشك ببن
بیرەکان ئاویان نەمێنێ
سەروچاوەکان بێخێر ببن
قڕ لە دەغڵ وئاژەل کەوێ
پەپولە کانی ناو چیمەن
گوڵی خۆیان هەڵوەرێنن
بالندەکانی کۆچەری هەڵێن
هێلانەی کۆتر برمێن .. بروخێن
مل قوت بوونەوە .. لەش کەوتنە سەریەك
ڕۆژان رویشتن یەك لە دوای یەك
ئەوجا ئەفسانەی‌تر رێك دەخرێ .
**(« خۆی کڕ دەکا بۆ ماوەیە ك .. پاشان دەلێت » )**
چی دەکەی قوربان ..
گەر شازادەیەك لەم وڵاتە
دڵی بداتە کچە هەژارێك
**قرقاش** : **(« بەتیزەوە » )**
لاشەی هەر دوو کیان بۆم بێننە ئێرە
جا با ئەو کەسەی خوای شادی وپیتە
بتوانێ تخون ئێرە بکەوێ
خۆی بدا لە قەرەی هەورو گرەی من
**(« وەزیر خۆی دەکێشتەوەو کڕ دەبێ .. قرقاش نارەحەت دەبێ » )**
**قرقاش** : **(« هاوار دەکا » )**
چیت گوت .. دەڵێ ی‌چی ..؟
بیر لەوە نەکەیتەوە
خوایەکی نەزان‌و بێ ئەقل وسپات
ئەتوانێت پەنجە بۆ موڵکم ببات
**وەزیر** : حاشا قوربان .. ببەخشە
من ئەوەم مەبەست نەبو ببەخشە
**قرقاش** : ئەوەت مەبەست بوو
بوم بێنن لاشەی هەر دووکیان ئێستا

**وەزیر** : بەلام قوربان ..
**قرقاش** : (**« ئاخوتنی دەبڕێت »**) سەرت .. پاسەری ئەوان هەر دوویان هەر دوو خائینان .. هەر دوو صەگان ..
**وەزیر** : (**« دەستی بە ئەستۆی یەوە دەگریت »** )
سەری هەر دوو خائینان .. هەر دوو صەگان
**(« دێتــە لای دەرەوەی شانــوو بە دەنگێکی بڵنـد هەواری دەرەوە دەکات »)**
**وەزیر** : پیاوە ماقوڵەکانی میللەت
هەژاران .. نەزانەکان
پاسەوانانی زانست وژیری
سەربازانی دادو داد گیرّی
هەرئێستابێنن .. لاشەی هەر دووکیان
لەشی هەردووکیان .. سەری هەردووکیان

**(« لەگەل خۆیدا قسە دەکات »)**
باسەرم بەلە شمەوە بمینێ ..!
**( «وەزیر دێتە نێزیك قرقاش .. بێ دەنگیەکی ناخوش دیار دەبیت هەر دووکیان تەماشای دەرگای شانودەکەن .. پاش کەمێك دوو سەر باز دێنە زۆر لاشەیەکیان هەڵگرتوە .. چەرچەفێکیان بــە سەرداداوە .. بەرامبەری « قرقاش » دادەنــێن دەچنە دەرەوە . قـرقاش خــۆی لە لاشەکە نێزیك دەکاتەوەوبــە صەولەجـانەکـەی جەرجــەف لەسەر لاشەکەی هەلدە گریتو تەماشای ناکات »)**
**وەزیر** : ئەوە کەلاکی کچەکەیە قوربان !
**(« هەر دوو سەر بازەکە دێنەوە زۆرێ لاشەیــەکی تری پیچـاویان هەلگرتوە لە پێش « قرقاش » دادەنێن » )**
**(« قرقاش خۆی نێریك دەکاو جەرچەف لە سەر چاوی هەلدەگرێت . بــەوێنەی پێشــەوە . کە دەبینیت .. دەمی دەکــاتەوەو ئــەیــەوێ بکەوێت ولە خۆبچێت » )**
**قرقاش** : کورِم .. کورِم .

------

کوڕی شازدەم

**(« بە وێنەیەکی هەستیری »)**

**هەستە .. هەستە ..**

**لەسەر شان وملی مردن مەنو**

**(« بە بلندترین دەنگ هاوار دەکا »)**

**هەستە کورم ، گوایە گوێت لە من نی‌یە**

**(« بەشکەستنەوە » )**

بەوریگایەدا رۆیی .. گوێی لە من نەگرت

بەوریگایەدا چوو .. بۆ تاریکستان

ژنانی جیهان .. دەست کەن بە گریان

با پەری‌یەکانی دەریا بێنە دەر

لە ناو دلان وکۆلانە کانی ئاو

بابۆ کورم بگەرێن .. بپشکنن

بزانن گیانی لە ناوچێ سەدەفێکا بە جێ ماوە ..؟

با پەری یەکانی ئاسمان بفرن

بەر زبینەوە ژۆرووی هەورەکان

بۆ گیانی پاکی کورم بگەرێین

لە ناو هەورانا .

یالە ناوەندی ئەستێرەکانا

**(« ئاگای لە خۆ دەبێتەوە کە لە وەزعێکی شکەستو بێ هێزدایە بەرامبەر وەزیرەکە ی . دووبارە دەگەر ێتەوە وەزعی پێشوودا وخۆی لە وێنەی بەرزو بلندو ستەمداری‌دا دیاردەکا » )**

**قرقاش** : مردن لە گەلما قەد سەر ناکەوێ

بەژنی بلندی من نەوی ناکا

سەری بەرزی من پێی دانانەوێ

دەمی شەمشیری تیژم کول ناکا

بڕۆ دەرەوە ناو میللەتی کڕ

ئامادەیان کە بۆشەرێکی تر

------

قەلاّی ولاّتی مردن دەرمێنین
کاروانێك دیل ودەسکەوتان دێنین
سەرەو ژێر دەکەین خوای چاکەو شادی

**(« وەزیر خۆی ئامادە دەکات بۆ دەرچوون .. ئاگای لە هەراو قەلە بالغێك دەبێت کەلە دەرەوەی شانودێت ئەو وقرقاش تەماشای یەکتر دەکەن »)**

**دەنگەکان** : ( «لەدەرەوە » )
دەریا پڕ بو
ئاو سەر ڕێژ بو
مردن روخان .. مردن روخان
ئێمە لاشەکەمان دەوێتەوە
تەرمە کەیمان دەوێتەوە

**دەنگێك** : تەرمی شوخی میللەتی سەربڕاو
لاشەی کچە هەژاری کوژ راو

**دەنگێك** : نا .. نائێمە داوای لاشای قاتیلەکەی دەکەین .

**دەنگێك** : تەرمی قرقاش

**دەنگە کان** : تەرمی ئەو . تەرمی ئەو .. تەرمی ئەو ..

**(« کۆمەڵە جوتیارێك گۆڕدەبنە ناو شانودا هەر یەکەك ئامێرەکی کشت وکالی تیژی بە دەستەوەیە .. قرقاش و وەزیرەکەی دەلەرزن لەترسان .. قرقاش شمشیرەکەی هەلدە کێشێ بەلاّم پێش بەرزبوونەوەی جوتیاران خۆی‌و وەزیرەکەی تەواودەکەن . هیندەکیان لاشەی کوروکچە کوژ راوەکان دەبەنە دەرەوەی شانو .. ئەوانەی تر لە تەرمی قرقاش ووەزیرەکەی دەدەن وهاوار دەکەن :**

**پێکەوە** :ـ دەریا پڕ بوو
ئاوسەر ڕێژ بوو

مردن .. روخان

مردن .. روخان

**( پاشان لاشەی هەر دووکیان بە دوای خۆیاندادە کیشن‌و دەبەنە دەرەوەی شانو .**

جوتیارەك دەچێتە سەر عەرشی قرقاش دادە نیشێ وپێدەكـەنێو تەماشای خۆی دەكا .. یەكەكیان هێرش دەباو رۆژ نامەكەی پارچە پارچە دەكاو فڕەی دەدا .. ئەوی تروینەی تەرازوی داد دەباتەوە جێگای خۆی .. بە تەواوی هـەڵیدەواسێتـەوە . دەست بە شـایی وسەما دەكەن لەسەر ئاوازی ئەو گۆرانی یەی « قرقاش » قەدەغەی كردبوو .. دەنگی موسیقا بەرز دەبێتەوە .. جوتیاری سـەر تەختی سەلتەنەت جێگای خۆی چاك دەكات ودەست لە رانەكانی وبالیفەكان دەدات .. ئەوانەی لە نـاو شانـودان شایی دەكـەن .. كۆمـەڵەیەك جـوتیاریتـر دێنە ژۆری شـانۆ .. هـاوبـەشی لەشـایی دەكـەن .. سەربازەكان كڵاوەكانیان فڕەدەدەن وشایی دەكەن » )

**جوتیارێك** : بژی شای دادگێر ودادپەروەر

**جوتیارێك** : ئێمەینە .. گەل و شاو داد گێرو دادپەر وەر

**هەموویان پێكەوە** : ئێمەینە شاو دادگێر .

ئێمەینە شاو دادگێر .

**دوایی**

پێرست :

## پەیڤەك :

ناوی ئەم کتێبە « ١+٤ » دوور نی‌یە غـەریب بێت ... بەڵام لەبەر ئەوەی چوار لەو شانونامانە زادەی بیری منن‌و یەکەمیان وەرگێڕاوە لەزمانی عارەبی‌یەوە ... ئەوەیە هۆی هەڵبژاردنی ئەم ناوە بۆ کتێبەکەم .

ئەز دەرچوی پـەیەمـانگای هـونەری شـانۆ نیم ... من لە زاوکی‌یەوە شەیداو ئەڤیندرای ئەم هونەرەم ... زۆرم لەسەر ئەم هونەرە خوێندوتەوە بەهەمـوو لایەکـانی‌یەوە .. کـەچی هەروەك قوتـابی‌یەکی کـەشکی سەرەتـایی ئەم هـونەرەم ... هیوادارم بەم هەوڵە توانیبم هـاوبەشی لەکـاروانی هونـەری شانۆگەری کوردی بم بۆ پێش خستن‌و پەرە پێ‌دانی ئەم لایە گرینگەی ئەدەب‌و توری میللەتەکەم ..

**نافع**

**تصميم : اسماعيل خياط**

السعر (